

# دیوانی حەمدی

عەبدوڵڵا خدر مەولوود

# دیوانی حەمدی



**ئەحمەد بەگی فەتتاح بەگی ساحێبقڕان**

ساغکردنەوە و ڕێکخستن و چاپکردنی
عەبدوڵلا خدر مەولوود

ناوی كتێب: دیـوانی حـەمـدی
ئامادەكردنی: عـەبدوڵڵا خـدر مەولوود
نەخشەسازی ناوەرۆك: ئاری ئەحمەد
ڕێكخستنی تازە و هەڵەچنی: نووســەر
نەخشەسازی بەرگ: محەممەد زادە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر
چاپ: پێنجەم، هەولێر، (٢٠١٣)
نرخ: (٨٠٠٠) هەزار دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان
ژمارەی سپاردنی (١٣) ی ساڵی (2013) ی دراوەتێ
بەهاوكاری
سندوقی كۆمەكی داهێنانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
چاپكراوە

# دیــوانی حــەمــدی

ساغکردنەوە و ڕێکخستن و چاپکردنی

عــەبدوڵلاّ خدر مەولوود

هەولێر ٢٠١٣

## چاپەکانی دیوانی حەمدی

- چاپی یەکەم، بەغدا (١٩٥٧)
- چاپی دووەم، سلێمانی (١٩٨٤)
- چاپی سێیەم، هەولێر (٢٠٠٨)
- چاپی چوارەم، هەولێر (٢٠١٠)
- چاپی پێنجەم، هەولێر (٢٠١٣)

## سوپاس و پێزانین بۆ:

* ماموستای گەورەم د. مارف خەزنەدار، بۆ بیر و ڕا و سەرنجەکانی، کتێبخانەکەی .

* برای بەڕێزم ماموستا سەردار عوسمان بەگی حەمدی.

* خوشکی بەڕێزم ماموستا سنەوبەرخانی عومەر بەگی حەمدی، دەسنووسی بنەماڵەی بەڕێزیان خستە بەر دەستم و خۆشحاڵیان دەربڕی بە چاپکردنەوەی دیوانی حەمدی .

* برا و ماموستای دەسڕەنگین بەڕێز محەممەد زادە، ئەو بەرگە قەشەنگەی پێشکەش بە دیوانی حەمدی کردووە.

* برا و ماموستای هونەرمەند و لێهاتوو قەرەنی جەمیل بە پەنجە ڕەنگینەکانی وێنەی حەمدی بۆ ئەم دیوانە کێشاوە.

# پێشەکی

## مارف خەزنەدار

حەمدی

نیو سەدە پێش ئێستا لە بابەت حەمدی یەوە گوتوومە (حەمدی بە ڕاستی شاعیر بووە، تەنیا شاعیری تایبەتی شتێك نەبووە، بەڵکو شاعیری دەروونی خۆی بووە، شاعیری کوردستان بووە، شاعیری بەهار و ئەرز و ئاسمان و شەو و ڕۆژ بووە، شاعیری هەموو ژیان بووە).

شاری سنە تەنیا میعمار و ئەندازیاری بینا و حەکیم و دانا و پیاوی ماقووڵی نەداوەتە خوشکە بچووکەکەی شاری سلێمانی، بەڵکو نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیریشی پێشکێش کردووە، لەناو ئەمانە، تەنیا لەماڵێك دا سێ شاعیر هەڵکەوتوون، بنج و بنارانیان دەچێتەوە سەر شاری سنە: سالم (١٨٠٥ - ١٨٦٩)، کوردی (١٨١٢ - ١٨٥٠)، حەمدی ( ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان).

حەمدی یەکێکە لە گەورە شاعیرانی کورد، یاخود شاعیرە مومتازەکانی پلە یەك بە پێی تیۆری ڕەخنەگرانی کلاسیکی عەرەب لە سەدەکانی ناوەڕاست کە بۆ شاعیرانی خۆیان دایانناوە.

حەمدی لەناو قاڵبی کۆن شیعری کوردی تازە کردۆتەوە، ئەو بابەتانەی بۆ شیعری ئایینی و شیعری دڵ و دەروون و ویژدانی بەکارهێنراون ئەو هاتووە بۆ مەبەستی تازە بە تایبەتی فیکری

کوردایـەتی و نـەریتی کـوردەواری بـەکاری هێنـاون. شۆرشـێکی بنـەڕەتی لەشیعری کوردی دا کردووە.

ئەگەر زۆربەی شیعری تازە (کێش و قافیەی هەمـەجۆر و ڕەنگاوڕەنگ) لە دوا ڕۆژدا لەناو بچێ شیعری حەمدی جاویدانییە و لە کەڵك ناکەوێ.

<u>دیوانی حەمدی</u>

دیوانی حەمدی یەکێکە لە کامڵترین دیوانی شیعری کوردی.

١- لە ڕووی ڕوخسارەوە شاعیر هەموو بـەحرە عـەرووزی یـەکانی کە لـە شـیعری کـوردی دەکەونـە بەرچـاو بـەکاری هێنـاون. قافیـەی هـەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی هەیە.

پـاش قافیـەی یـەکجار زۆرە. تـاك و چـوارین و پارچـە و غـەزەل و قەسیدە و موستەزاد و تەرجیع بەند و هەموو هونەرەکانی دیکەی لەم بابەتە لە دیوانی حەمدی دا خۆیان دەنوێنن.

٢- لـە ڕووی ناوەرۆکـەوە حەمـدی شـیعری کـوردی بـە شـێوەیێك دەور کردۆتەوە نموونەی هەموو مەبەسەکانی شیعری عەرووزی ئیسلامەوی (عەرەبی و فارسی و زمانە تورکییەکان) لە دیوانی دا کۆکراونەتەوە.

حەمـدی لـە ڕەوانبێـژی شـیعری عـەرووزی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لای نـەداوە. ئەگـەر هەنـدێ وێنـەی ئـەوان وەکـو وەرگـرتن لـە بەرهـەمی دا ببینرێن، ئەمەیان زۆر کەمە و زۆربەی گەمـە بەلاغییـەکانی داهێنـراون و سەرچـاوەیان دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕەوشـت و تەقالیـدی ناوچـەیی کـوردەواری،

ئەمەیان ڕەنگە تاپلەیێك لەگەڵ ئەدگاری هەندی لە بەلاغەی شیعری نەتەوەکانی هیند و ئێرانی و هیند و ئەوروپی و تاڕادەیێك لەگەڵ ناوەرۆکی شیعری نەتەوە مەسیحییەکانی قەفقاسیش ڕێك بکەوێ، وەکو شیعری میللی سەر زار و کلاسیکی ئەرمەن و گورج.

شیعری حەمدی ڕەنگدانەوەی خەبات و هەڵسان و ڕاپەڕین و شۆرشی کوردە لە کوردستانی باشوور (ناوچەی سلێمانی) لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، لەبەر ئەوە نرخی مێژوویی لە نرخی جوانکاری و هونەری کەمتر نییە.

عەبدوڵلا خدر مەولوود

لە ماوەی کارکردنم لە زانستگای بەغدا بە زۆری سەر قاڵی لێکۆڵینەوە بووم لە هەموو قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا بایەخێکی زۆرو تایبەتیم بە نالی و حەمدی دەدا، بەلام لەبەر ئەوەی خوێندنی باڵا لە سەرەتادا لە بەشەکانی زمانی کوردی نەبوو، ئەو ئارەزووەم لەو کاتەدا نەهاتە دی.

بەلام لە دوایی قوتابی عەبدوڵلا خدر مەولوود فریام کەوت، بۆ هەردوو خوێندنی باڵا، ماجستێر و دکتۆرا حەمدی و نالی هەڵبژارد. بەسەرکەوتوویی هەر دووکیانی گەیاندە ئەنجام.

ئەوەی لەم لایەنەوە گرنگ بێ ئەوەیە نامەکانی ماجستێر و دکتۆرا بە ڕوو زەردی و کەساسی لە دەلاقەکانی نامەخانەی زانستگا نەمانەوە. چالاکانە هەموویانی کرد بە کتێب و بلاوی کردنەوە.

لەگەڵ ئەوەی دووچاپی دیوانی حەمدی لە ناوەوە بوو، بەلام پێویست بوو جارێکی دیکەش چاپ بکرێتەوە، چونکە چاپی (بەغدا ١٩٥٧) تۆزی نەمابوو ، چاپی دووەمی (سلێمانی ١٩٨٤) هەموو کەمو کورپێکی چاپی یەکەمی جێ بەجێ نەکردبوو.

ئیتر عەبدوڵلا خدر مەولوود لەسەربنج و بناوانی هەردووچاپەکە و دەسنووسی تازە و زانیاری نوێ سەرکەوتوانە توانی ئەم پرۆژە گرنگە بگەینێتە ئەنجام. واتە عەبدوڵلا بە ئیملای تازە شیعری حەمدی ساغ کردۆتەوە، خۆی خەریکی لێکدانەوە و شیکردنەوە و ڕخنە سازی نەکردووە، تەنیا هەنگاوی یەکەم و هەرەگرنگی ناوە بەوەی دیوانی شیعری حەمدی بە پوختی خستۆتە بەر دەستی خوێنەر و خوێندەواری کوردەوە. پیرۆزبایی لە د. عەبدوڵلا خدر مەولوودی قوتابی کۆن و هاوپیشەی ئێستام دەکەم، بەم کارەی نامەخانەی کوردی دەوڵەمەند کردووە.

مارف خەزنەدار

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکو

١٦ی ئەیلوولی ٢٠٠٨

# پێشەکی ئەم چاپە

دەسپێك زۆر سوپاس بۆ خوای مەزن و دلۆڤان، کە ئەو توانا و سەلیقەیەی پێ بەخشیم بتوانم ئەو پرۆژە گەورەیە بۆ دیوانی حەمدی بە ئەنجام بگەیێنم، تا ڕاددەییێکی باش ئەوەی لە مێشکم بوو بۆ ئەو دیوانەی بکەم. حەمدی حەقی بەسەر هەمووومانەوە هەیە، ئەگەر توانیبێتم شتێکم بۆ کردبێ و گیانە گەورەکەم شاد و ئارام کردبێ دیارە ئەوەش ئەوپەڕی هاتنە دێی ئاواتەکانمە.

حەمدی شاعیرێکی بە توانا و دەوڵەمەندی دنیای شیعری کلاسیکی کوردیمانە. دەوڵەمەند وەك ژمارەی شیعر و قەبارەی دیوان، دەوڵەمەند لە بەکارهێنانی هونەرەکانی شیعر. حەمدی داهێنەر و ئەفرێنەری قوتابخانەی شیعری کرمانجی خواروەوە، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە لە سەر دەستی مەلا خدری نالی هاتبووە دامەزراندن. دیوانەکەی حەمدی فەرهەنگێکی گەورەی زمانی کوردییە، تەژییە لە وێنەی شیعری هونەری ناسك و ڕەنگاوڕەنگ، کە بلیمەتی حەمدی لەوێوە سەر هەڵدەدا.

دەمێکە ئەو کارەم بە پرۆژەییێکی گەورەی ژیانی ئەدەبیم ناو برد بوو، بۆیە هەر چیم کردبێ حەمدی شایەنی زیاترە. دوای ئەوەی بنەماڵەی حەمدی ڕەزامەندی ئەوەیان نیشاندا کە دیوانەکە بۆ جاری سێیەم چاپ بکەم، ئەو مافەیان پێ ڕەوابینیم و تەنانەت دەسنووسی بنەماڵەشیان خستە بەر دەستم، زۆر سوپاسیان دەکەم و جێی ڕێز و حورمەتن، بە تایبەتیش مامۆستایانی بەڕێزم کاك سەرداری عوسمان بەگی

حەمدی، سنەوبەر خانی عومەر بەگی حەمدی، کە نەوەی حەمدین و پەرۆشی خۆیان بۆ ئەو کارە نیشاندا، دووبارە سوپاسیان دەکەم.
بۆ ئەو چاپە دەسنووسی بنەماڵە و هەردوو چاپی (بەغدا، سلێمانی) پێك گیراون، وشە بە وشە و دێر بە دێر بەرامبەر یەکتر کراون، بۆ هەر جیاوازییەك لە وشە یا دەستەواژە تەواوەکە یا ئەوەی لێك نزیکن ئەو وەرگیراوە. سەرچاوەیەکی زۆریش تەماشاکراوە، سەرەنجام ئەوەی لە بەر دەستدایە بەرهەمی هەوڵ و کۆششێکی زۆر و بەردەوام بووە، هیوادارم ئەم کارەشم جێی ڕەزامەندی هەموو لایەك بێت و بە تایبەتیش ڕەوان شاد حەمدی.

ئەو کارانەی لەو چاپەی دیوانی حەمدی ئەنجام دراون و بە ئاشکرا پێیەوە دیارە، لەم چەند خاڵەی خوارەوە کۆکراونەتەوە:
١- ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین، ئەوە یەکەمجارە لە مێژووی شیعر و دیوانی کلاسیکی کوردیمان، کە وێنە و دەنگی (ئـە، ە) بگوازرێتەوە شوێنی سروشتی و ئاسایی خۆی و چیتر ئەو هەڵەیە دووبارە نەبێتەوە لەوەی کە ئەو دەنگە (ئە) کە وەك فەتحەی عەرەبییە، شوێنی وێنە و دەنگی (ھ) ێ بگرێ. لە دیوانی حەمدی ئەو لاسایی کردنەوەم وەلانا، ئەو هەڵە درشت و نارێك و گەورەیەم ڕاست کردەوە.
٢- دیارە بەها و هێزی دەنگی (ئە، ە) نیو یا لە خوار دەنگی (ئەلف، ئا) یە بەچەند پلەیەك، بۆیە لەپێش دەنگی (ئا) دانراوە و هاتووە، ئەو دیوانە بە دەنگی (ئە، ە) دەس پێدەکات، نەك (ئەلف، أ) .

٣- ئەو چاپە ، شیعرەکانی لە پچرپچڕی و ناڕێکی ڕزگار کردووە، بە دانانی ناوەرۆك و فیهرەستێکی تازە. هەر شیعرە و ژمارەی تایبەتی خۆی دراوەتێ، وەکو هونەرەکانی شیعریش زیاتر لێك نزیك کراونەتەوە.

٤- ئەوەندەی لە توانا دابووە هەوڵمانداوە هەڵەکانی چاپەکانی پێشوو (کە لە ڕاددە بەدەرن) بنبڕ بکەین، یا هەر هیچ نەبێت زۆر کەمی بکەینەوە.

٥- ڕیزبەندی هەموو شیعرەکان، جیا لە هەردوو چاپەکەی پێشوو، بە پێی دەنگەکانی سەروا و بەوردی بەدوای یەکدا تۆمار کراون.

٦- بە شێوەیەکی بەرچاو دیارە، کەم و کوڕی و بۆشاییەکان لە شیعر و دێرەکانی هەردوو چاپەکەی (بەغدا و سلێمانی) عیلاج کراون و پڕ کراونەتەوە. سێ دێرە شیعری تریش لە سێ سەرچاوە دۆزراونەتەوە و لە شوێنی خۆیان دانراون، تاکەکانی (١، ٥، ٦). جگە لەوانەی لە دەسنووسی بنەماڵەدا هەبوون و بۆ یەکەمجارە بڵاو دەکرێنەوە (دێر، چوارین).

٧- وێنە و دەنگی ئەو پیتە عەرەبیانە (ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ) کراون بە دەنگی ئاسایی (س ، ز ، س ، ز ، ت ، ز) جا چ وەك سەروای شیعر هاتبن، یا لەناو وشە شیعرییەکاندا بە کار بردرابن.

لە کۆتاییدا ئەگەر خزمەتێکی بچووکی شیعری کلاسیکی کوردیم کردبێت، ئەوە لە خۆشی و ئاواتەکانم نزیك بوومەتەوە.

# سەرگوزشتەی شاعیری مەشهوور
# ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقڕان[(١)]

(حەمدی) ناوی ئەحمەدە کوڕی فەتتاح بەگی حاجی برایم بەگی مەحموود بەگی ساحێبقڕانە. ئەو مەحموود بەگە بە (مەحموود بەگی باشچاوەش) یش ناودەبرێ، کە یەکێك بووە لە دوانزە سوارەی مەریوان[(٢)] کە تا دنیا مابێ باسی ئازایی و نەبەردییان قەت لە بیر ناکرێ. عەلائەددین سەججادی دەڵێ: (ئەحمەد بەگی گەورە کە باوکی ئەو مەحموود بەگە بووە، ئەو یەکێك بووە لە دوانزە سوارە)[(٣)]. حەمدی ساڵی (١٢٩٣) ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨٧٥ - ١٨٧٦) ی زایینی لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، حەمدی خۆی لە دێرە شیعرێکیدا ئەمەی بڕاندۆتەوە[(*)]:

**گەڕام بۆ ساڵی تەئریخی ویلادەتم و غەریبم دی**

**بەهیجری (حەمدی) دەنکێ بوو لەناو (باری غمم) دەسکەوت** ٢٦٩

(باری غمم) بەپێی حرووفی ئەبجەدی دەکاتە ١٢٩٣ك = ١٨٧٥ - ١٨٧٦ز ساڵی لە دایك بوونی حەمدییە. لەحوجرەکانی مزگەوت دەستی بە خوێندن کردووە و پاشان قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە، لە ڕوشدییەش خوێندوویەتی و هەموو ساڵێکیش هەر بە یەکەم دەرچووە. بۆ خوێندنی دینی و فێربوونی زمانی عەرەبی و فارسی هات و چۆی مزگەوتەکانی کردووە و بەتایبەتیش خانەقای (مەحوی) شاعیر کە پەیوەندییەکی زۆر باش و تەواوی لەگەڵدا هەبووە.

حەمدی خاوەن بیر و هۆشێکی فراوان بوو، ڕۆشنبیرێکی گەورەی کورد بووە، کەسایەتییەکی مەزن و پێش چاوی شاری سلێمانی بووە. بە دەست و قەلەمی، دەست و چەکی، ئەو سەروەت و سامانەی هەیبووە لە خزمەت و پێناوی میللەتی کورد و خاکی کوردستانی داناوە. یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی کورد و تێکەڵ بە ڕووداوە گەورەکانیش بووە.

لە یەکەم کابینەی حکومەتی مەلیك مەحموود وەزیری گومرگ بوو. (وەك لە شیعرا تەبعی مەوزوون و سوارچاکی عەرەسەی شیعر بووە هەروەهاش لە سوارچاکی و تفەنگ چییەتیدا یەکەم بووە)[٤] شاعیرمان خاوەن بیروباوەڕێکی پتەو و نەگۆڕ و کوردێکی بێ غەل و غەش بووە.

هەردوو شاعیری گەورەی ناوداری کورد کە لە نەوەی ساحێبقڕانن (مستەفا بەگی کوردی) مامی باوکی بووە، (سالم) یش ئامۆزای باوکی حەمدی بوە. کە سلێمانی داگیرکراوە ماڵەکەی دەستی بەسەرا دەگیرێ و ناو ماڵەکەشی دەبردرێ، کتێبخانەیەکی گەورەشی هەبووە سووتاندراوە و لەناو کتێبەکاندا (کوللیاتی کە بە زمانی تورکی و فارسی و کوردی مودەووەن و زادەی فیکری حەمدی بووە سوتاندراوە)[٥] پاش تێکچوونی شۆرشی شێخ مەحموود حەمدی ژیانی بە فیراری و ئەشقییایی، دەربەدەری و ئاوارەیی لە دەشت و کێوەکانی کوردستاندا بردۆتە سەر (لەم ڕێگەیەدا سەروەتێکی گەورەی هەبوو هەمووی دانا)[٦]وە، لە بیر و بۆچوون و لەبەر هەندێ هەڵوێست بەینی لەگەڵ شێخ مەحموود خراپ تێکچووە، پاش دروست

بوونی حکومەتی عیراق لە ساڵی (١٩٢٤ - ١٩٢٦) بەڕێوەبەری شارەوانی سلێمانی و پاشانیش نازری ئەعشاری ناوچەی سووورداش بووە.

لە دەسنووسە بچووکەکەی مامۆستا نەجمەددین مەلا ئەو زانیارییە ئاوا تۆمار کراوە: (موخەممەسی ئەحمەد حەمدی بەگ لەسەر غەزەلی مستەفا بەگی کوردی، سێ ڕۆژ پێش مردنی وتوویەتی) :[٧]

هەزار حەقم وت و نەشبووم وەکو مەنسوور بەسەرداری

نەما کەس دامەنی نەگرم پەنام بردە هەموو شاری

(مەرحووم ئەحمەد حەمدی بەگ شەوی پێنج شەممە سعات ٣ی عەرەبی ٢٨ی شەعبانی ساڵی ١٣٥٥ هیجری ڕێکەوتی ١٢ای تشرینی ساڵی ١٩٣٦م بەهۆی سەکتەی قەلبەوە پیاڵەی گوژاڵکی لە دەست ساقی ئەزەل وەرگرت و دەماغی بە نەشئەی بادەی فەنا مەست بوو)[*]

حەمدی پیاوێکی ئازا و چاو نەترس و سەخی و بە ڕەحم بووە ، زۆر یارمەتی هەژارانی داوە، قسە خۆش و دەنگی گەورە بووە (زۆر حەزی لە دەنگی گۆرانی بێژ ڕەشۆڵ کردووە. ماینەکەی کە ناوی "ماینە شێ" بووە یەکجار زۆری خۆشویستووە)[٩]

حەمدی پێنج ژنی هێناوە، وجاغ و بەر ئاگردانی بە کوڕ و کچ و نەوەکانی ئاوەدانە .

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(١) ئەو ناونیشانە لە دەسنووسێکی بچووکی مامۆستا نەجمەددین مەلا وەرگیراوە.

(٢) جەمال بابان، چەند سەرنجێك دەربارەی دوانزە سوارەی مەریوان، گۆڤاری بەیان، ژمارە (٥)، کانوونی دووەمی ١٩٧١، ل ١٠.

(٣) علا ء الدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی معارف، ١٩٧١، ل ٢٥٦.

(*) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧٧.

(٤) نەجمەددین مەلا، دەسنووسی (سۆزی نیشتمان)، ل ١٢.

(٥) نەجمەددین مەلا، دەسنووس، ل ٢.

(٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٣.

(٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧.

(*) (لەلایەن ماموستا نجم الدین ملاوە أم فردەی آتی کە نیوە شعری آخری بە أبجد تأریخی وفاتی مرحوم احمد حمدی بگە دای ناوە

تأریخی وفات دل غمگین أکا

گول / لە باخ / وەری / بلبل / شین اکا

٥٠ + ٦٣٨ + ٢٣١ + ٦٤ + ٣٨٢ = ١٣٥٥ ك

= ١٢ ی تشرینی سالّی ١٩٣٦ م

امە تأریخی وفاتی مرحوم احمد حمدی بگە خوا لی ی خوش بی)

(٨) ئەو زانیارییانەم لە سەنەوبەر خانی عومەر بەگەوە بە نووسین پێگەیشتووە.

# تێهەڵکێشی

## سووڕەتی فاتیحە

١

یا ڕەسوولەڵڵا زەلیل و دڵ حەزینم ڕەحمەتێ
موستەمەند و بێ قەرار و بێ قەرینم ڕەحمەتێ
ڕاحەتی قەلب و وجوود و عیززەتی نەفسم نەما
وەختی مەرگە حافیزی ئیمان و دینم ڕەحمەتێ
داد خواهی مەحشەر و پشت و پەناهی موئمینان
هەمنشینی زاتی دنیا ئافەرینم ڕەحمەتێ
با بە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَحِيمْ) دەس پێ بکەم
چونکە تینووی ڕەحمەتم دڵ ئاگرینم ڕەحمەتێ
کائینات (الحَمْدُلِلّه) پڕ لە نووری ڕوویی تۆ
ئەی حەبیب و یاری (رَبِّ العَالَمِين)م ڕەحمەتی
ئەی وجوودت مەنبەعی ئەڵتافی (رَحْمنِ الرَحِيمْ)
(مَالِك)ی ئیعجازی شەمسی(يَوْمِ الدِّين)م ڕەحمەتێ
قائمی (إِيَّاكَ نَعْبُد) بووم بە تەبلیغاتی تۆ
وا (وَإِيَّاكَ) دەڵێم بۆ (نَسْتَعِين)م ڕەحمەتێ

(إهْـدِنـا) بـۆ ڕێـی (صِرَاطَ المُسْـتَقِيم)م تـو خـودا

بـۆ ئیرائـەی ڕێیـی (صِـرَاطَ الَّـذِيـن)م ڕەحـمـەتێ

مـن لـە (أنْعَـمْتَ عَـلَيهِـمْ) بـا نـەبـم بێ بەش چییە

خۆ سەگی کۆیـی ئەمیرول مورسـەلینم ڕەحـمـەتێ

(غَيْرِ) ی تۆ کێ من لـە (مَغْـضُـوبِ عَلَـيْهِمْ) لائـەدا

وەك (وَلاالضّالّيـنْ) ئـامیـن هـیچ نـەبینم ڕەحـمـەتێ

تـوخودا غافڵ لە (حـەمدی) قـەت مەبـە ڕۆژی جـەزا

ڕووسییاهـم ئـەی شـەفیعەل موزنیبینم ڕەحـمـەتێ

# قەسیدەی خواناسی

(١)

٢

لە مەوجی بەحری فیکرەتدا پلۆپووشانە گەردانم
لە ئەوجی نووری وەحدەتدا میسالی زەڕڕە حەیرانم
دەڵێم بەحسی نەکەم عەقڵی کولی تێدا کە کولْ بووبێ
لە بازاڕی کەماڵم چی لە نەقد و جنس کە نوقسانم
جگەر سووتاوم و توشنەی نماوی ڕەحمەتم دەشڵێم
بە ئاهی سەردەوە خاکی بەسەرداکەم بە دامانم
بیرونی دائیرەی دەرکە لە ئافاقی فەهم خاریج
چییە و چۆنە و چ نەوعێکی بکەم تەعریفی نازانم
کە مەخلووقی نیگاهێکی بەجارێ کائیناتی بێ
لە عەقڵێکدا چلۆن وەسفی ئەگونجێ ماڵی وێرانم
لیقایەك جوملە ئەجرامی سەماوی زەڕڕەییێکی بێ
ئەگەر وەسفی بکەم ئەلبەت بە ویسعەت ئاسمانانم
بە ئەمرێکی بووە نەشبێ بە ئەمرێکی کە مەوجوودات
دەبەحسی قودرەتی وا ناکرێ حەقمە کە نەتوانم
زیایی جیلوەییێکی ئاگری بەردایە کێوی توور
بە بەحسی کلکە تووریکم کە من مەعلوومە بریانم

مەلائیك تێنەگەی بێ ئەنبییا بەو داخەوە چووبێ
بەیانی ئەو شكۆهە قابیلە بیگرمە سەرشانم
نە ڕۆحانی نە جیسمانی بە كونهی زاتیا زاتی
نەبووبێ كەس بكا خاكم بە سەر من چیم كە ئینسانم
كە بێمە سەر سیفاتی بێ نیازی دێتە گۆ خامە
قەڵەم نیم من دەڵێ سەفحە منیش كەی عەرشی ڕەحمانم
سەمیعێ بێ كە ببیێ دەنگی خشپەی مار و مێرووله
لە شەرحیدا كەڕ و لاڵم ئەگەر سوحبان و لوقمانم
عەلیمی كوللی شەیئێ نوقتەیی پەرگاری عیلمی بێ
دڵۆپێكە بەیاناتم ئەگەر خۆ بەحری عیلمانم
بەسیری ڕۆژی ئەووەل كردەوەی ئاخر شەوی دیبێ
چلۆن وەسفی دەنووسێ بۆم ئەگەر بینایی چاوانم
خەبیرێ بێ خەبەرداری خەیاڵی فاسدی دڵ بێ
زمان دەشكێ لە وەسفیدا ئەوەندەی تۆزێ بزوانم

خودایێ ساحیبی ئەم عەدل و دادەی ڕۆژی مەحشەر بێ
بەحەشری وەسفی ئەو وا من چی یارامە کە بڕوانم
کە ناوی لەرز لە دڵ دێنێ پڕیشکی قەهرییە دۆزەخ
بەسەر بەحسی سیراتا گەر بچم بێ شك دەچێ جانم
فەسوبحانە لە خەللاقێ بەهەشت یەك شەممە لوتفی بێ
بەباسی غونچە بوو پشکووت دڵم وا گوڵم و خەندانم

وەکو ڕۆژێ کە گیرابێ بە ڕەش لەم مەتڵەعە (حەمدی)
سەرت دەربێنە با عالەم بزانێ چەند پەرێشانم

## قەسیدەی خواناسی

## (٢)

٣

لە ترسی قەهری تۆ ڕەببی خەریکی شین و گریانم

جگەر خوێنین و دڵ غەمگین و شێت و وێت و عوریانم

بە دڵما فکری پرشنگی جەحیمی قەهری تۆ دەڕوا

گڕێ دەگرم دڵی دۆزەخ دەسووتێ هەر بەسووتانم

لە ئەفعالی منا ڕەش بوونەوە ئێسقان و گۆشت و پێست

بە ڕیشی سپیەوە هێشتا خەریکی سواغی ڕیشدانم

نە ئەمرێکم بەجێ هێنا دڵی پێ خۆش بکەم جارێ

نە خۆم لادا لە نەهییێکت موفەڕڕەح بێ کە ئیمانم

جەهەننەم باوەڕم نایێ قییامەت من لە خۆی بگرێ

ئەڵێ ئالوودە ناکەم من بە پیسی حەیفە دامانم

خەجاڵەت بووم لە ئاقاری گوناه ئالوودەیی من بوو

گەلێ ڕوو زەرد و شەرمندەی بەرابەر نەوعی عسیانم

پەشیمانی ئەگەر شاخی لە ئینسان دەرئەکرد بێ شك

لە گەردوون توند دەبوو شاخم بە دڵ هێندە پەشیمانم

حیسابی خۆم دەکەم قەسدم وەهایە خۆم بسووتێنم

کە فکری بەحری ئیحسانت دەکەم پڕ ئاوە لێوانم

ئەمەند خاکم بەسەردا کرد لە سەردا ئەشکی خوێنم ڕشت
بە کەیفی خۆم شوکر ئێستا لە خاك و خوێن غەڵتانم
کەل و کۆم و شەل و شێت و فوتادە و پیر و داماوم
بەجێ ماوم لەگەل چبکەم لەگەڵ هاوفکری شەیتانم
شەپۆڵمدا بە بەحری ڕوو ڕەشی و عوسیانەوە هاتم
بە یادی قەترە ئاوێکی لە بەحری لوتف و ئیحسانم
وەکو کێوی گوناە هاتوومەتە بەر بارەگاهی تۆ
کە موحتاجی بەقەد یەك پەڕڕەکاهی عەفوی غوفرانم

بەجاهی شەوکەت و ئیجلال و قەدر و قودرەتت (حەمدی)
ببەخشە چونکە وەك بەردی دڵی دەریایی حیرمانم

٤

بە هەر لادا کە ئەنواڕی درێژە بۆ ڕجا دەستی
یەدی بەیزایی مووسایە کە دەربێ بۆ عەتا دەستی
بە ماهی نەخشەب و باڵی هومایی دەوڵەتی دانی
لە هەر لایێ کە یەك ڕوویی ببێ یا بێ ڕیا دەستی
لە سەر عەرزی موحیببەت گەر حکومەت دابنێ ڕەسمی
کەسێ شەققولقەمەر ناکا بەرێ بۆ مەرحەبا دەستی
بە قانوونی تەبیعەت ئێستە باقڵ میسلی دەستی دز
لە بندا ئەیبڕن گیرا لە بازاڕی وەفا دەستی
سەدایی ئەلقوبوولم هاتە گوێ لەم ئاسمانانە
لە میحرابی بڕۆی تۆدا کە بردم بۆ دوعا دەستی
نە ڕێژی تا زەمان خوێنی هەزاران عاشقی شەیدا
چلۆن پێیی حەنایی کا ئەنگوشت نوما دەستی
لە تۆفانی بەلادا چەندە بێ باکن خەراباتی
ئەڵێی ئەم فیرقەیە ئیرسەن هەیانە بۆ شنا دەستی
خەلەل نادا بە قووەی ئەهلی هیمەت زوعف و ڕەنگ زەردی
کە کاهی ڕادەکێشێ نیشیە خۆ کارەبا دەستی
چ پەروامە ڕەقیبانت ئەگەر فیرعەون و هامانن
کەلیمە عاشقی پیرت کە نایە سەر عەسا دەستی

لە نووری مەی کە جامێکی بلووریـن پڕ ئەکا ساقـی
ئـەڵێی دێنێتـە دەر ڕۆژێ لـەمەتڵەع وەك چـرا دەسـتـی
لە یەخخەی شـەو کە سەر دێنێتە دەر ئەم ماهـی تـابـانـە
ئـەڵێی جانانـە دەردێنێ لـە گیرفـانـی کـەوا دەسـتـی
هەتاکەی (حەمدی) بۆ شەوکەت لە ئەحوالی زەمان دەدوێ
کە وەختی ڕۆیینـە هەڵـمەت بـەرە بـۆ ئاشـنـا دەسـتـی
چ ئەمڕۆ بێ چ سبحەینێ چ تۆ چی کافەیی مـەخـلـووق
لـە وادی مـەحشـەرا وێڵـن هـەتـا ئـەو دەردەخـا دەسـتـی

کەوایە فرسـەتـە لـەم مـەتڵـەعـە وەك پارسـای پـارس
سـەرت دەربێنە بـۆ عـەرزی تـەمـەننا بۆ سەنا دەسـتـی

# شیعری نەعت

## (فارسی)

٥

ببر بَـر دامَــن ظـلّ رسـول کـبرِیـا دسـتـی
ببـر بـَـر کیمیـای خاکپای مصطفی دسـتـی
ببر بَـر گـوهَـر دریـای إحـسـان خدا دستـی
ببـبر بـَـر جـوهـر فــرد تـجلای لـقـا دسـتـی
ببر بَـر طُـرهٔ طـومـار فـخـر أنبـیا دسـتـی
بـبــر بـَــر درهٔ فــرق کــلاه أولـیـا دسـتـی
ببــر بـَــر أفضــل أولاد آدم بــرگـشـا دسـتـی
ببر بـر أرشـد عــالـم چـو کمـتر بـینوا دسـتـی
ببر بهر تضرع بر در شـمـس الـضـحی دسـتـی
ببر مـحض تلطف در بــر نـورالـهــدی دسـتـی
بگـو أی صبح أول مطلـع خـورشـیـد رُخسـارت
رسان در ظلمت شام قیـامـت سـوی مـا دسـتـی
بگو أی خاکپـایت چـاره سـاز علـت عـصیـان
خُدا را عاشق بیـمـار خـود را أز شـفـا دسـتـی
مگو در بحر عصیان غرق خواهم گشت در محشر
چو نبود أز نـگـاه دیـدهٔ مسـت شمـا دسـتـی

بگـو مـن در جهِـان ننهـاده ام پای رضـایت را
ولی مَخصوص شأن تست أز حسن رضا دستـی
ز صدق و عَدل أز علِم و حَیا مـا را بیرون آرنـد
أبوبـَکر و عـُمـر عـُثمان و حَیدر پیشوا دستـی
گر أز بهـر رجـا نبود شهیدان کـی بیرون آرنـد
ز لالـه در زمیـن شـورزار کـَربـلا دستـی
قدم در وادی عشقت نهد فرزانه چون مَجنـون
بغَیر أز نـاقـهٔ لیلـی زنـد بـَر مـاسـوا دستـی
عجب نبود ز شوق أز خاکسارت گرد بـَر خـیزد
زنـد بـَر پـردهٔ رُخسار خورشید سَمـا دستـی
مَقام سَـبزهٔ راهـت بدَست آرد خـضر ألْبَتْ
زنـد بـَر جـَاوِدانـی پـا بـَر آب بـَقـا دستـی
نـوشتن بـَر صَحایف أز أدب نـبـود ثـَنـای تـو
أز آن بـَرهَـمزدن را أز قـَضـا آرد صَبـا دستـی

نـگردد ملتجی بـَر درگه او (حَـمـدیا) محـروم
زند بـَر حلقه‌اش شام و سَحر أز ضیا دستـی

## مەدحی پێغەمبەر(*)

٦

ئەی مورسەلی حەق تاجی سەری جوملە پەیەمبەر
ئەی نووری دڵی ئەرز و سەما سەییدی سەروەر
ئەی گەوهەری بەحری کەرەم و ڕەحمەتی خالیق
لوتف و کەرەمت بەحرە ئەدا مەوجی منەووەر
ئیسمت کە زوبانی قەڵەمی کردوە موزەییەن
شێوەت بە دڵی لەوحە ئەدا زینەت و زێوەر
پایەی حەرەمت جووتە لەگەڵ پایەیی کورسی
هەر عەرشی بەرین لایقە بۆ مەنزلی دلبەر
هەر ڕۆژی ئەزەل لەمعەیەکی داوە جەمالت
ئێستەش ئەدرەوشێتەوە ئەو لەمعەیە وەك خۆر
یەك زەڕڕە غوباری قەدەمت کەوتە هەواوە
کردوویە دەماغی مەلەکووتیشی موعەتتەر
خاکی بەری پێت گەر بدەنە دەستی سولەیمان
ئەیکاتە دوو دیدە بەمەسەل سورمەیی جەوهەر
وەك گەردی بوراقت شەوی میعراجت بەجێ ما
جبریلی ئەمین نەیبوو ئیتر قووەتی شەهپەڕ

---

(*) ئەم قەسیدەیە ساڵی ١٩٢٣ وەك ستایش و سکاڵایێك بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسراوە.

سەرگەردی سەری تۆیە هەتا ڕۆژی قییامەت
شەمس و قەمەر و ئەنجوم و ئەفلاکی مودەووەر
دەریایەکی ئاگر ئەوە بۆ مونکیری تۆیە
بۆ مەنتەبەعەت باغی بەهەشت چەشمەیی کەوسەر
مەعلوومە ئەوا بوون و نەبوونی هەموو ئەشیا
بۆ تۆیە لەبەر تۆیە خودا کردی موقەددەر
خوسرەو کە سەری دابوو لە بەرد بەردی لەسەردا
کیسرا دڵی هەر زوو شەق و پەق بووبوو بە خەنجەر
هەنگامی حەشر مونتەزیری مەرحەمەتی تۆن
جننیی و پەری ئینس و مەلەك بەندە وو قەیسەر
فەرمووتە کە حامیی و کە سایەی سەری ئێوەم
ئەو وەختە کە ناپرسی برا حاڵی برادەر
ئەو ڕۆژەیە باقڵ بە پەرێشانیی خەڵقا
موحتاجە ئەکا شین و ئەکا گریە توانگەر
گەر حەشرە ئەمە فەرموو شەفاعەت بکە بۆمان
تا ئەجر و جەزا و کردەوەمان بینێتە دەفتەر
دنیایە ئەگەر بۆ چییە ئەم حەشرە لە سەر چی
ئەم عالەمی ئیسلامە دەکەن بۆچی موکەددەر
ئیسلام و یەهوودیی و نەسارا وو مەجووسی
بێزارە وەلێ قیسمی موسڵمان زیاتر

چۆنت کە ئەکرد کافری موتڵەق بە موسڵمان

بەو نەوعە موسڵمانە ئەکەن ئێستە بە کافر

نەدرابی بە تۆ خاتەمی ئەموت کە ئەمانە

نێزیکە بدەن خاتیمە بەم دینە سەراسەر

پڕ شاری سلێمانییە هەر میسلی زەبانی

ئەلوات و شەقی جەردە وو دز قاتیل و ڕەهبەر

لەوساوە حکوومەت نییە بەربوونەتە میللەت

جاف و هەمەوەند بانەیی وو مەنگووڕ و پشدەر

تالاّن و بڕۆ و کوشتن و حەپسە لە هەموو لا

ساحێب عەلەم و تەپڵە ئەڵێی دێوە ستەمگەر

ئەم شەکوەیی ئێمە کە لە باریٚ دەنکێکە

بۆ تۆیە لە لای تۆیە لە دەست نوتفەیی حەیدەر

ئەو حاڵە کە کورد و عەرەبی تیایە دەشوبهیٚ

بەو حاڵە کە خۆی کردی بەمەسکوونەیی خەیبەر

نەژیاوەتەوە هەر وەکو ئەم تائیفە هەرگیز

کوللە و سن و موور و مەگەس و عەقرەب و ئەژدەر

گاهیٚ دەبنە دوژمنی ئەتراك و گەه ئینگلیز

گاهیٚ لە عەرەب چاو ئەبڕن گەه لە عەجەم سەر

ناموس و حەیا چوو لە سەدای تۆپ و تەیارە

هەر حامیلەیە کەوتووەتە کووچە ئەخا بەر

ئـــەو تیفلە سەری فێری ســەرینی پــەڕی قوو بـوو

بێ چارە لــە چۆلێکــە ئـەکا بــەردێ بــە بـوســتــەر

ســەر سەوزێ لــە هەر جێگە ببێ سەرکەشە ئێستە

بــەم ڕووتییە فکرێکی لــەسەردا هــەیــە عــەرعــەر

ئەو شەخسە کە ئەیکرد بە دوعا مەنعی موسیبەت

ئێســتاکــە بــەڵایــە کــە دەگا دەســتــی بــە وەڕوەڕ

ئــەو پیرە کە ئوفتادەیی مەسجید بوو لــەبــەر فەیز

هــەڵساوە وەکـــو فیتنە قـــەدی میسلی ســنــەوبــەر

حەججامی فــەقیر نــانــی بـــڕا خــوێنــی قیفـالی

ئەم خـەڵقە بـە خەنجەر دەگــرن بـۆچییە نـەشتـەر

ســوبحانە چ دەرد و چ بــەڵایەکــە کــە خــەڵــقــی

کێشــاوەتە ئەم خانەیە وەك چەرخی لە چەنبەر

ئـــەهلی شـــەرەفی ئێســتە لـــە هـــەر لایێ کـــە مابێ

وەك (حەمدی) هەموو دەربەدەر و خوار و موحەققەر

# ڕۆژ

## (١)

٧

جوملە ئەجرامی سـەماوی چاکر و سوڵتانـە ڕۆژ
بـاعیسی بوونی گیاهو کافەیی حەیـوانـە ڕۆژ
جیلوەگاهی نوورە هەر کەس تێکەڵی دنیا نـەبـێ
خۆ لە بەر شێتی نییە تەنها لـەسەر کـێوانـە ڕۆژ
زلـفەکانی بـا لـەسـەر ڕوولابـدا بـۆ تـەجـرەبـە
بـابزانـم ئەمشەویش ئاخـۆ دەڵێن پـەنهانـە ڕۆژ
من لە پێکەوتم لە دووی ئەوماهە جا نۆبەی ئـەوە
کـائینـاتـی پشـکنیوە وێڵ و سـەرگـەردانـە ڕۆژ
ئەم کسووفە تووڵی کێشا ئەی فەلەك فێڵێ نەکەی
وا لە کوێتایە دەخیلە وەختی زوو بـەردانـە ڕۆژ
تا بە قەد زەڕڕەم بمێنێ شەرتە مەیلی هەر نەکەم
دابنیشێ گـەر لـە جێگەی حەزرەتی جانـانـە ڕۆژ
شەمعی ڕووتی دیوە بۆیە ئاگـری تێ بـەربـووە
مـەیلی سووتانی هەیە بـاقلْ وەکو پـەروانـە ڕۆژ
زلـف و خـاڵت بێتە داو و دانە ئەمجا تێدەگەی
خـۆی دەخاتە داوەوە بـۆ خاتـری ئـەو دانـە ڕۆژ

یەك كەڕەت چاوی خوماری دلبەری دیوە مەگەر
مەست و مەدهۆشە خەریكی كەوتن و هەڵسانە ڕۆژ
گەر بە ئومێدی ویساڵی شامی زلفی تۆ نەبێ
سەر لەكەل دەرنایەنێ هەر نایەوێ ئەو مانە ڕۆژ
ڕۆشناییم من بە چاوی خۆم نەدی ڕۆژی فیراق
هەر شەوێكی ڕووتە خەڵقی بۆ ئەڵێن تابانە ڕۆژ
هێندە شەوقی دیدەنی نووری جەمالی تۆم هەبوو
نەم ئەدی گەر هەڵبهاتایە لەسەر ئەم شانە ڕۆژ
من كە مەخمووری نیگاهی دیدەكانی مەستی تۆم
لێوی لێ نادەم پڕیكا گەر لە مەی پەیمانە ڕۆژ
خۆزگە خوا ڕەحمی ئەنایە دڵت و تەشریفت دەهات
هەڵئەهات هەر ئەو سەعاتە بەم شەوی هیجرانە ڕۆژ
هەر شەوی نەوعێ ئەدا زینەت بە ئەوجی ئاسمان
ماهی من هەر تێدەفكرم ڕۆژەكەی ڕۆژانە ڕۆژ

با عیلاجی مەتڵەعێكی تر بكەم تا تێبگەن
مونكیری ئەهلی مەحەببەت شەو یەكێكە دوانە ڕۆژ

(٢)

٨

سەر لە جێگەی پێدەنێ کوللی سەحەر مەستانە ڕۆژ

بۆ زیارەت دێتە کەعبە ئەو دڵە ئەو جانە ڕۆژ

کەعبە چی کاشانەیێکە سەر لە پایەی عەرش ئەدا

حەیفە بیکەی گەر بە نیمەی خشتی ئەو ئەیوانە ڕۆژ

ئەو شەوی میعراجە فەخری ئەنبییا دەعوەت کرا

تاقە نانێ بوو خرایە سەر دەمی ئەو خوانە ڕۆژ

شانی ڕاگرت ئەو دڵ و جانە کە پێی نایە سەری

دەستیکەوت ئەم شەوکەتە ئەم عیززەتە ئەم شانە ڕۆژ

دووپەلی نالی بوراقی ئەو شەوە لێکەوتبوو

من دەڵێم مانگە یەکێکیان و ئەوی تریانە ڕۆژ

ئەو شەوە ئەو ئیحتیرامە تا حەشر نابێتەوە

گەر دەگیرێ بیکەنە قوربانی ئەم قوربانە ڕۆژ

ئەو شەوە فەرقی لەگەڵ ڕۆژا دەزانی چەندەیە

هەروەهای دانێ کە چۆڕێ شیرە شەو قەترانە ڕۆژ

وەختی خاسی وەسڵی مەحبووبی جەنابی کیبرییا

هەر شەوێ بێ بۆی دەبێتە عاشق و دێوانە ڕۆژ

ئەم حیسابە (حەمدی) قووڵە قەت سەری لێ دەردەکەی

عەقڵی پێ نەشکاوە هێشتا بەم هەموو عینوانە ڕۆژ

## شەو

٩

بێ سەرو سامان عەجەب دەریایەکی قەترانە شەو
ڕۆژی ڕەش بێ دۆزەخێکی موددەتی هیجرانە شەو
کردەوەی دنیا کە هەر عەیبە دەبێ داپۆشرێ
پەردەییێکی موختەسەر خاسی بەسەردا دانە شەو
ڕۆژی کردە پەردەوە باقڵ لە باخەڵ مانگی کرد
بۆیە وا وەختی زەفافی ئەکسەری بووکانە شەو
بەدری کامیل سەر لە گۆشە دەردەهێنێ هەر دەڵێی
خێڵە ڕەشماڵی ڕەئیسی جوملە مەهڕوویانە شەو
دەردەخا هەر کەس بە ڕەنگی خۆیەوە وەك سیم و زەڕ
وەك محەك مەفتوونی تەدقیقاتی عوششاقانە شەو
عادەتا هەر وەك سەحیفەی بێ سەوادە بەدری ڕووت
حاشییەی هەر لازمە زلفی مەهی تابانە شەو
هەر لە ئاوابوونی ڕۆژانایە ماتەم دەیگرێ
عەرزی ئەندامی دەکا دیارە لە ڕەش پۆشانە شەو

هەر شەوی میعراجی تەنها کائیناتە قیمەتی
لەیلەتولقەدری موقابیل سەد هەزار ڕۆژانە شەو
خاڵ و میل و چاوی خۆمی پێ بڕێژم فرسەتە
پڕ دڵی چونکە جەواهیر سورمەیی چاوانە شەو
ڕۆشنایی گەر لە دڵتایە شەوە وادەی ویساڵ
بۆ عیبادەت خەڵوەییێکی موشکیل و ئاسانە شەو

حەق وەهایە تا قییامەت (حەمدی) باسی شەو بکەم
چونکە ڕۆژی ڕۆشنی ئەهلی دڵ و ڕەندانە شەو

## ئـەرز

١٠

پێی بەسەردا قەت مەنێن نامەرد بە عیزز و شانە ئـەرز
خاکەکەی پاکی غوباری مەقدەمی جانانە ئـەرز
فەرشی ڕەنگینی گوڵستان ڕەشکی گوڵزاری جینان
گەوهەری دەریایی سونعی حەزرەتی یەزدانە ئـەرز
دەم بە دەم بۆ حاڵی عالەم دێتە جۆش و گریەوە
ئەشکی سوور وو سوێری بەحری ئەحمەر و عوممانە ئـەرز
دیم یەنارداغی وتم بێ شك سکی سووتا بە من
مادەرێکی موشفیقە لوتفی لەگەڵ ئینسانە ئـەرز
جوودی حاتەم بۆتە ئەفسانە لە عالەمدا کەچی
لوقمە نانێکی بەویش داوە لەسەر ئەم خوانە ئـەرز
ئاسمان و مانگ و ڕۆژ و ئەنجومم دی تێگەییم
ساحبی خەیمە و سەرا وو شەمعی ئاوێزانە ئـەرز
هەرچی دڵ مەیلی دەکا هەرچی نەفس لازمیەتی
حازرە بۆچی ئیتر کوفرە بڵێم ڕیزوانە ئـەرز
گەه سەری وەك کۆنە پۆشی سەوزە شاخی موددەتێ
وەك موریدی نەقشبەندی سەرسپی بەندانە ئـەرز
بەم هەموو عەیبانەوە خەڵقی کە ئەچنە ماڵەکەی
ئەیگرێتە باوەشی خۆی ئەو هەموو عەیبانە ئـەرز

ئەو هەموو بێ شەئنییە دەگری لەسەر شانی کەچی
تێك نەچوو ئەمما لە حیرسا دەم بە دەم لەرزانە ئەرز
گەر لە سەقفی گونبەدی ئەفلاکەوە سەیری بکەی
سابیت و دەورانە ساف و هەم خڕە هەم پانە ئەرز
دەردەخا ئەجناسی ئەشیا غائیبیشیان هەر دەکا
چەند دڵی مەعموورە یا ڕەب ماڵی چەند وێرانە ئەرز
زوبدەیی ئەولادی فەخری ئەنبییا بۆ کەم بوو بۆی
کائیناتی سەر بە سەر بۆ کرد بەیەك کاشانە ئەرز
ئاسمانی کرد بە سەقف و ئەنجومی بۆ کرد بە مێخ
کەهکەشانی کرد بە تاقی پێشی ئەو ئەیوانە ئەرز
ئەو مەهەی چونکە لە دڵدایە لەبەر چاوی نییە
بەحری ئەشکی جارییە ئەمما دڵی خەندانە ئەرز
ئەو دەمە بۆتە زیارەتگاهی ئەفواجی مەلەك
لێوی گەییە پێی و دەستی گەییە ئەو دامانە ئەرز
هەردەبوو بمزانیایە قووەتی ئەو ڕۆحەیە
سیقلەتی بەم زۆرییە وەستاوی بێ بونیانە ئەرز

(حەمدی) لادە لەم حیسابە کافییە بۆ تێگەییو
مەنبەعی کوللی شتێکە مەنسەبی هەموانە ئەرز

## ئاسمان

## بۆ ئەختەر ناوێك

١١

بەرگی تاقەی شینی ئەم شەو كردەوە بەر ئاسمان

ناشێ بۆ زینەت بكا تەقلیدی ئەختەر ئاسمان

مەشقی ئەبرۆ و ڕوومەت و پرشنگی چاوی ئەو نەكا

بەم گەلاوێژ و هیلالە و بەدری ئەنوەر ئاسمان

شەق بەرێ شێواوی شێوەی ئەو كلاوە لارەیە

بابدا سەد شیر و خورشیدیش لە ئەفسەر ئاسمان

نەك بگرمێنی و ببارێنی لەبەركا بەرگی شین

قەت بە تۆ نابێ سكی بدڕێ بە خەنجەر ئاسمان

تۆ كە دەركەوتی وەكو ڕۆژ ون ئەبن ئەستێرەكان

تەم دەكا ئەوسا دەچێتە شكلی سێبەر ئاسمان

ئافەرم ئەی ئەرز هەڵتهێنا حەقیقەت ئەختەرێ

میسلی دەرناخا لە دەهرا گەربخا بەر ئاسمان

شەوقی پشكۆی ڕوومەتی تەئسیری كردە عوودی زلف

بۆیە كون كون بوو میسالی تاسی مەجمەر ئاسمان

نەشئەیی جامی شەراب و لەنجەییێكی تۆی نییە

خۆر بەدایم خول بدا هەڵڕێژی كەوسەر ئاسمان

شەوقی ئەختەر هەروەکو ڕێگا بە (حەمدی) گوم دەکا
جیلوەییێکت لا دەبا ئەلبەت لە میحوەر ئاسمان
من حەسەد بەعزەن بە چاوی خۆم دەبەم سەیری دەکا
چی بڵێم کەوتۆتە شەوقی عەشقی دلبەر ئاسمان
حەق نییە تەعنە لە ڕەفتاری بدەم بێ چارەیە
گێژ ئەدا عوزری هەیە بێ پا وو بێ سەر ئاسمان
وەك فوتۆغراف خۆزگە عەکسی کردەوەی خەڵقی ئەگرت
جا وەرە دەرخا سیجیللو شەرحی دەفتەر ئاسمان
ئەم کیبارانە ببینێ چەرخی خۆی حاڵی دەبێ
تا خەجاڵەت بێ کە چەند بوو سفرە پەروەر ئاسمان
بۆ سەگێکی گەر فڕێدا لوقمەییێکی چەور و نەرم
تەوقی زەڕینی ببێ ئەیکاتە مل کەر ئاسمان
هەر لق و پۆپی درەختی میوەدارە وشك ئەکا
هەر خەریکە سەوز و تەڕ کا داری بێ بەر ئاسمان
من لە لام قەبرێکی تەنگە کێ دەڵێ ئەرز واسیعە
خۆ سەری واگرتووە بەستوویە شەشدەر ئاسمان

قەت خەلاسیمان نییە مەوجێ نەدا بەحری وجوود
غەرقی کا وەك کەشتی خستوویە کە لەنگەر ئاسمان

## بەهار

١٢

بولبول بە خەندە دێت و دەڵێ دەی بڕایەوە
شاخی درەختی عومری شکۆفە ژیایەوە
تەقلیدی دیدەکانی منی کردووە زەمین
هەرکۆرە شێوە چەشمەیی تێدا ژیایەوە
نەورۆزە جەژنە بۆیە چراخانی عالەمە
یا ئاگری لە عومری شیتا چوو کوژایەوە
عەرعەر لە لەنجەدایە لە ڕەقسایە سەروەکان
بەرگی چەمەن لە ڕەنگی زموڕڕود کرایەوە
خەیرولخەلەف نیهالی لە جێدایە سەوز و تەڕ
داری بە بەفر و بادی زمستان شکایەوە
گوڵ دەستی یاسەمینی لەملدا بە شەرمەوە
فەرمووی زەمانی بولبولە جا بێتە کایەوە
وا تێدەگەم لە بەزمی چەمەندا چراچییە
لالە کە ڕۆنی شەونمی کردە چرایەوە
بۆ گەردەنی هەمیشەبەهارە کە زلفییە
عوقدەی دەمی سیاهی ڕەیاحین کرایەوە

قەترانی تێ تکاوە ئەگەر داغی دڵ نەبێ
یا سورمەیە بەدیدەیی نێرگس گەشایەوە
لیمو قەدەح لە چاوی ترنجە کە نۆشی کرد
بەدمەست و سەرکەشە بەشی خورما نەمایەوە
هەنگامی وەسڵە شەست پەڕ و مینا بەیەك ئەگەن
پەردەی زەفافە قەوس و قەزەح ڕاکشایەوە
گەردن کەچە وەنەوشە لە زەنبەق سەلام ئەکا
نیلوفەرە بە قەهقەهە لێوی کرایەوە
بووکانە ئەرخەوانە لە تارایی پەمبەیی
خوێنی دڵی بە غەمزەیی نەسرین تکایەوە
چەترێکی بێ بەرە کە درەختانی نارەوەن
خیوەت کە دووبەرە نییە سێبەر بە لایەوە
گریەی عینەب بە باوەشی بادامەوە دەڵێی
تیفلێکی شیرە خۆرە بەبەر مەمکی دایەوە
هەر عەتری بیدمشکە نەسیمی سەحەر کەدێ
نەی دێتە ڕەقس و لەنجە دەخاتە سەمایەوە
خوێنی ئەمەندە گەرمە گوڵی ئاتەشی سەحەر
لوئلوئی شەونمی لە مەراقا تاوایەوە

پەستی مـــورادە حیکمـەتـــە بـالآیــی شـۆڕەبی

وەر نـە جـوانــە قـامـەتــی بــۆچـی چـەمـایــەوە

کەو کۆسـاری گـرتـووە سـەحــرایە مـەسـکـەنـی

هودهود بە تاج و حـاجـی بە شــان و عـەبـایــەوە

تەبــریکی سـالّـی تازەیـی بـازە مــرادی کــونــد

هــاتــۆتــە دەر لــە خـەڵــوە بـــە ڕیشـی ڕپایـەوە

(حەمدی) نەبیّ خولاسە بـە جـەمعی خەلایقـا

عـومـرێکـی تــازە لــەززەتــی تــازە بـەشـایـەوە

## دڵ

### ١٣

شـوعـلـەیـی ڕۆژی فـیراقــە ئـاگـری بــرژانــی دڵ
هــەر نەسیبی دوژمنم بـێ قـرچــەیـی بــریـانــی دڵ

دڵ شـکـاوم فـرسـەتـە قـابیز بکێشە ئێستـە ڕۆح
فـەرقی پێ نـاکەم ئەگـەر بمـرم لە هەوڵـی ژانــی دڵ

ناوی عەشق ئەرز و سەمای هێناوەتە لـەرز و سـەما
بۆتـە جارووکـەش کـەچی بـۆ کولبەیـی ویـرانــی دڵ

ڕۆحی خاقان و گوڵی فەغفوور و مەغزی قەیـسـەرە
ئـەم خـەمیرە بـۆیـە غـەڕرایـە نەشـئـەی فنجـانــی دڵ

چاوی لــەبرێزی سـرشکی شادییـە ساغیرکـەشی
قـەهقەهـەی مینا نـەخاتـە بـەر کـوڵـی گـریـانــی دڵ

هـەر ئـومێدێکی چـرۆیێ داغـی هــەریەك غونچـەیێ
مـەحبەسـی ئەربابی مەعنا بـاغـە وەك زیندانــی دڵ

میسلی نەی شێرانی دڵ هەر یەك نەوایێ لـێ ئەدەن
وەك جلووسی ساڵـی تـازەی کردبـێ سـوڵتانــی دڵ

ئەمری سوڵتانان هەموو تەکلیف و قەید و زەحمەتە
توڕڕەیی ئازادی و ختووتی شـادییە فـەرمانــی دڵ

دەرکی بێ چاوحیسسی بێ دەست سەیری بێ پێکەی ئەکا
ئـافـەرم بـۆ دیـدەن و بـۆ حیسس و بۆ سـەیـرانـی دڵ
ڕۆحـی بـێ ئیـدراك و وێـڵ و هـەرزەگـەردم بـۆچییـە
ساحبی تـەمکیـن و دەرکـە دەیـکـەمـە قـوربـانـی دڵ
ڕۆح بـە هـاتـووچـۆیی ئـەو وەك توتیی چۆتە قەفەس
بـۆ فـڕیـن ئـامـادەیـی وەسـتـاوە تـا وەسـتـانـی دڵ
سـەیریـکـەن پووش و پـەلاشی ڕوویـی لافـاوی بـەهـار
عاشقی تـەمسیـل ئـەکـا کـەوتـۆتـە بـەر جـەریـانـی دڵ
سـوورەتی هـەرچـی کـە چـاوم دیویـەتـی گـرتوویەتـی
ڕۆژ دەڵێـی زیـزانـەیـە کـەوتـۆتـە سـەر خـەرمـانـی دڵ
میحوەری ڕۆحـە و ڕەئیسـی هـەیـئەتـی بەزمـی وجـوود
بـا وجـوودا عـەرشـی ڕەحمـانـە ئـەڵێـن عینـوانـی دڵ
عەشـقە شـۆرە سەوزە سـوورە شـینـە عـەیشـە شـادییە
فیتنـەهـا گـرتـوویـەتـی لـەم سـەفـحـەدا دامـانـی دڵ
ئـەو زەمـانـە بـۆ هـەمـوو دەردێ دەوایـان دادەنـا
ئـەهلی حیکمـەت دەردیـان دانـاوە بـۆ دەرمـانـی دڵ

(حەمدی) ڕەنگە دڵ پەری بێ دەست لە کـاری قـەت مـەدە
گـرتـنـی شـێتی دەبـەخشـێ هـاریـیـە بـەردانـی دڵ

## ساقی نامە

١٤

بـــەسـاقـی بـلێن موژدەبێ نـــەوبـــەهـــار
دەمـــیدا لـــە لـێـوی خـەتـی جـوێـبـار
هەڵئەقوڵێت و دەپژێ لە چەشمە و لە بەرد
چـی ئاوی وەك ئەڵماسی خاڵـی لـە گـەرد
خـەرامـان لـە دەوری گـوڵستـــان چـنـار
خـەریـكـن دەكـەن مـەشـقـی بـاڵای یـار
چڵـی گـوڵ بــە پــەنـجە ئیشـارەی چـرۆ
دەكـا غـونچـە دەردی دڵـی بەسـمـەن بـۆ
لـەسـەر عـارزی گـوڵ ڕەیـاحـیـنـی ڕەش
بـە دامـەن دەكـا ئـاتـەشـی غونـچە گەش
قـەدەح عـەتر دەگێڕێ بـە جـامـی سـەحـەر
بـە بـۆ كـەوتـووە نـافـی ئـاهـوویـی بـەڕ
لـە ڕیــزی زومـــڕڕود كـرا فـەرشـی بـاغ
پـــڕی شـەونـمـە لالــە وەك شـەوچـراغ
هـــەوا میشكبـار و هـــەور دوڕ نیـسـار
زەمـین لایـێ خـازیـن لـــە لایـێ عـەتـار

کە گـوڵ سواری چڵ بوو هەڵی گـرتــە غـار
خــەزان تیـپـی تـێکـدا خــزایــە مـەغـار

لـە گـیـــژ و خـــول و ئیـهتیـــزازی هـەوا
لـــە مـــۆسیقـــە دانــە درەخــت یـەك هــەوا

ســەروو چەپڵەڕێـزان دەکـەن تـەن بـە تــەن
تـەغـەنـنـوم دەکـەن بـولبـولانـی چـەمـەن

نـەسیمی سـەحـەر ڕاسـت ئەخوێنێ سـەبـا
لـــە شـۆری هــوزاران هـــەزار مــەرحـــەبـا

لــــە ئـــەوجـی بـڵـنـدی ســـەدای دورڕاج
بـە ئەسـتوون فـەلـەك بـوویـەتی ئیحتیاج

بـە تـەرتیب و ئـــادابـی نـەسـریـن و گـوڵ
حـەریفان دەنێن دەم لـە دەم دەسـت لـە مـل

لــــە یـــارانـی دێــریـــن ڕەفـیـقـــانــی نـوێ
پڕە سەر زەمین گوڵ بە گوڵ جوێ بە جوێ

بـە شـیـددەت دەکـەن مـەجلیسی ئینتیــزار
بـە زایـع نـــەچـێ شــەوکـەتی نـەوبــەهـــار

زەمـــان بـــۆیـــە ئـــارایـــشـــیـدا زەمـــیـــن
کـــە یـــاران لـــە مـــەولا بـــە شـــادی بژیـــن
وەرە ســاقییــا تــۆش بــە حــەقــی شــەراب
بــە مــەیخـانەیی ئــەرزی ئـەقــدەس تــوراب
بــە ئــەوجــی مــەقــامــی مــوعــەلــلایــی پیر
کە ئەو جیلوە بەخشە و کە ئەو دەستگیر
بــە فــەڕڕاشــی دەرگــاهــی پیری مــوغــان
کــە بــۆ پایــی بـۆســی قــەمــەر دەیــدوان
دەخـیلـــە مـــلی مـــەگـــرە هـــەڵــنــاگـــرێ
ســـوراحـــی ئـــــەزیـیـەت ســەهــل نــادرێ
بە ئـاوی مــوســـەفـفـا دەم و چـاوی جـام
بـشـۆ یـــادگـــاری جــەمــە و نـــابــەکـــام
دەرێنـە و پــــڕی کـــەو بـــدە دەم بـــە دەم
خــوم و شیشـە و جـامی دەم جـەم بـە جەم
لـە چی چەند و چلۆن و لە کـەی تا بەکـەی
بـە تــوولی زەمـــان دائیمـا ڕەتــلی مـەی

چ مەی ئاتەشین ڕەنگ و ئاتەش میزاج
کە شا سەر بە نەشئە بدا نەك بە تاج

چ مەی وەك برووسکەی هەوا توند و ساف
لە دەم تەزکییەی کا هەتا حەددی ناف

چ مەی نووری چاوی درەختانی ڕەز
دڵی جورعە نۆشانی پڕ کا لە لەرز

چ مەی زاهیرەن خوێنی جەرگی عەقیق
بە باتین شوعاعێکی نووری حەقیق

مەیێ بێ موقەتتەر لە ئاوی حەیات
کە بشواتەوە شەرحی ڕەسمی مەمات

خیلافی بکا ساقی ڕۆژی قییام
حەشر دێ بەسەریا ئیتر وەسسەلام

# کوردستان(*)

١٥

ئەی وەتەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە
ئیفتیخاری میللەتی کورد شەوکەتی عینوانتە
بەستە سەربەرزی ئێواران و سبەینان مانگ و ڕۆژ
وەك نیشانی ئیفتیخاری سنگ و نەجمەی شانتە
بەرق ئەدا و ئەڕژێ وەکو ئەمواجی گەوهەر چەشمەکان
ئاوە یا ڕۆحی ڕەوانی چەشمەیی حەیوانتە
ئاوە یا نوورە لە عەکسی خۆر کە دەبریسکێتەوە
ئەهلی حیکمەت وا دەزانێ دوڕڕەکانی کانتە
گوڵگوڵی سوور و سپی خاڵخاڵی خاکی ڕەش ئەڵێی
پۆدرەیی ڕوخسار و سورمەی ڕشتنی چاوانتە
عاشقی ڕەنگی خەزانی تۆیە بۆیە دێ بەهار
فەسلی هاوین گەرمی مەیلی بەفرەکەی زستانتە
بۆچی ئەنباری زەخیرەی کائیناتە شارەزوور
شەهرِبازاڕ خوانی میوانە لەبەر میوانتە
باسی میوەی تۆ دەکەم بۆیە قەڵەم هاتۆتە بەر
بەستەکانم بستەیی ئەهلی دڵ و عیرفانتە

(*) ساڵی ١٩٢٧ ی. ز. وتراوە.

بۆ ئەمەی جارێ بەسەرتا پێ نەنێم ئەفکاری من
یا بەسەر ڕۆیشتنە یا سەربەسەر هیجرانتە
پلپڵەی پشتێنی زێڕینی حەبیبی قەومی کورد
زڕنزڕە و پشتێنەیی بەردینی قەد شاخانتە
پۆیە سیروان و زەرب بۆ شاڵی چۆغە و ڕانکت
وەك حەریر دیجلەی جەزیرە با ئەدەی بۆتانتە
کورد کوڕەکاژاوی لووتی وا بلند کردۆتەوە
هەر وەکو شەمزینی بادین ئارەزووی بەرزانتە
ئاسمان وشاخی بەرز و سەتحی ئەرزت دەردەخا
ماڵی کوردیتو ئەوە دیوار و حەوشە و بانتە
پەیکوڵی تا قەسری شیرین ڕاکشاوە پێی کوڵی
دەستی قەندیلت درێژە بۆ چراچی وانتە
پیرەمەگروون تاجی شاهانەی بەسەر بەرزی فڕاند
تەم دەماوەند داگرێ مەحجووبی هەورامانتە
خەتتی دیوانی شکستەی گرد و لووتی بەرزی شاخ
وازیحە بۆ سەربەخۆیی تووڕەیی فەرمانتە

جار بە جار (حەمدی) گلەت گەر لێ بکا ناحەق نییە
جەردە ڕامەگرە نەڵێن خەڵقی کە جانی جانتە

## قەومی کورد

١٦

تا بزانن عالەمیٚ چەندە وەفاکردارە کورد

هەر ئەبیٚ تەعریفی ئەسڵی خۆی بکا ناچارە کورد

زۆر قەدیمن زۆرن ئەمما تەفرەقەی کردوون زەمان

وەرنە قەومیٚکی نەجیب و ساحبی میقدارە کورد

نوتفەیی ئاسور و جیٚگەی ئەووەڵی کابول بووە

نوتقی ئەوساکەی بە لەهجەی فورسی خۆش گوفتارە کورد

بەو زمانە گوردە ئیسمی یەعنی مەردی پەڵەوان

فیلحەقیقە بۆ شەجاعەت سەروەر و سالارە کورد

خزمی زاڵ و ڕۆستەم و گۆدەرز و گیو و بیٚژەنن

وا دیارە چونکە یەکسەر هەر دەڵیٚی شاسوارە کورد

سەرکەشی بوو واسیتەی هیجرەت لە کابولدا قەدیم

خۆ بە تەئریخی عموومی سابیتە ئینکارە کورد

دائیما بۆ عیززەتی نەفسە کە غیرەت سەرف ئەکەن

عادەتا شیٚری ژیانە یا وەکو ڕەشمارە کورد

کامەیان ئەدنایە دائیم دەم لە عولوییەت دەدەن

خان بڵیٚ یاخۆ نەڵیٚ قابیل نییە سەرکارە کورد

سەهوە ئومیٚدی ئیتاعەت کەس ناکا لەم قەومە بۆچ

چونکە هەر کەس مونفەرید سەیری دەکەی ئەحرارە کورد

واقیعەن قەومێ کە تەحسیلی نەبێ جاهیل دەبێ
هەر ئەساسەن موستەعیدد و ساحبی ئەفکارە کورد
وا زەمانە بەش دەکا ئیقبالی ئەقوامی جیهان
چونکە بەد بەختە خەریکی نەگبەتی و ئیدبارە کورد
تەجرەبەیکە جاهیلی وەك عاریفی قەومیترە
کوێری مادەرزادی سەیریکە ئولولئەبسارە کورد
ساحبی عەزمی مەتین و عامیلی وەقع و ویقار
کاشفی ئەمری نیهان و کاتیمی ئەسرارە کورد
شافعی مەزهەب موسوڵمانن تەعەسسوبیان هەیە
دائیما مەشغوولی تۆبە و زیکر و ئیستیغفارە کورد
خاکی کوردستانە جێگەی ئەکمەلی ئەهلی کەماڵ
ئەکسەر ئینسانی میسالی تیغی جەوهەردارە کورد
گەر ڕەقابەت مانعی ئەم قەومە نەبوایە بەیان
دەوڵەتی بوو سەربەخۆ ئەسبابی هێشتا دیارە کورد

گەرچی مەستی نەشئەیی بادەی غروور و غیرەتن
فیترییە (حەمدی) بەجارێ عاقڵ و هوشیارە کورد

## جەنگی دەربەندی بازیان(*)

١٧

وەك هەوا كەوتوومە گێژی گونبەدی ئەفلاكەوە
ڕەببی بیبینم وەكو كیسرا بە سینەی چاكەوە
بۆ كەسێ تا سەر وەفاداری نەبوو بێ مروەتە
سەیری ئەسكەندەر دەكەن ڕۆیی بە مشتێ خاكەوە
چاكە دایم هەر لە پێناوی خراپا ڕۆییوە
گەوهەری دەریا بە دایم وا لە ژێر خاشاكەوە
هەر شكستی ئەهلی مەعنای مەتڵەبە دەورانی پیر
ڕەش دەخاتە سەر سپی پیسی ئەكاتە پاكەوە
ئینتیقامی خۆم دەسێنم جەهل ئەگەر مانیع نەبێ
شوعلەیی ئاهم دەنێمە خەرمەنی ئیدراكەوە
خەرقەیی شاهو عەسای مووسا لە لام بێ شەوكەتە
فەخری ئێمە وا بە كەوڵی پۆست و دار مەشكاكەوە
عیبرەتە ئەربابی غیرەت تێبگەن من چی دەڵێم
ئەهلی عیسمەت حەپسە سەربەستی بە لای بێ باكەوە
قەومەكانی ڕوپیە خۆرم دێنە بەرچاوم ئەڵێن
كەر بە جۆ بمرێ شەهیدە سەگ بە گۆشتی لاكەوە

(*) ئەم قەسیدەیە ساڵی (١٩١٩) ی. ز. وتراوە.

لاتن و لۆتی نەفامن بۆ نیشات و مەنفەعەت

دەبنە قوربانی سەگێ بێ شك بە باب و داکەوە

بۆ نەمانی دین و غیرەت هیممەتی کورد و عەرەب

وا بەسەر لەوحەی کیتابی حەسرەتی ئەتراکەوە

تا دەبێتە مولکی ئەربابی حەمیەت کەم دەکا

ئاگری تاجر دەنێتە خەرمەنی مەلاکەوە

شەرتە تا ڕۆژی قییامەت دەست لە ئەژنۆ بەرنەدەم

سەر لە قوڕنێم بۆ سیادەت بەم دڵەی غەمناکەوە

بۆ دلێری حەزرەتی مەحموود مەمدووحی جیهان

تاقە یەك گوڵ بوو بە فەرقی پیری ئەحمەد کاکەوە

بۆ دوو مەحموودخان ئەمیری سەرحەدی ڕۆم و عەجەم

بوونە ئەسحابی قوڕەیش و چوونە سیلکی چاکەوە

سالی تەئریخی دەپرسی (أل کاك احمد غریب)(*)

کەوتە عالەم دڵ حەزین و دیدەیی نمناکەوە

---

(*) (أل کاك أحمد غریب)=١٣٣٧ ك، ئەو ساڵەی شێخ مەحموود بە دیل گیرا و نەفی هیندستان کرا (أ ، ل ، ك ، ا ، ك ، أ ، ح ، م ، د ، غ ، ر ، ی ، ب )

١ + ٣٠ + ٢٠ + ١ + ٢٠ + ١ + ٨ + ٤٠ + ٤ + ١٠٠٠ + ٢٠٠ + ١٠ + ٢ = ١٣٣٧ك = ١٩١٨ – ١٩١٩.

## شیوەنی کوردی باکوور(*)

۱۸

چۆن زمانی خامە نەشکێ نەپچڕێ ڕشتەی خەیاڵ
کاسەیی پڕ مێشکی کەللە بۆ نەبێ یەکسەر بەتاڵ
حامیی قەومی زەعیف و عامیلی عەدل و ئەمان
وا لە کوێ چۆنی بنووسم چۆن بنێرم عەرز و حاڵ
چۆن لە ژێر ئەم سێبەری گەردوونی دوونە دەرنەچم
خەسمی مادەرزادی قەومم ساحبی عەزمە و کەماڵ
چۆن لە ساحێب قودرەتی نەوعی بەشەر تەعنە نەدەم
بۆ لە بەختی ئێمەدا ئەمڕۆ هەموویان کەڕن و لاڵ
بۆ بەژێر بەحرا دەڕۆن و ئاسمانان کەشف دەکەن
بۆچی ناکەن کەشفی دەردی کوردی بێ چارەی شیمال
سەیری ناکەن وەك نیگاری لەوحی تەئریخی بەشەر
نەقشی کوڕڕەی ئەرز ئەکا وەك بەحری ئەحمەر خوێنی ئاڵ
کێ لە قانوونی بەشەردا دیویەتی ڕاستی بڵێ
بێ قەباحەت خوێنی ئەم کوردە لە کوللی کەس حەلاڵ
بۆ بە دارا بکرێ پیاوی تێگەیشتووی قەومی کورد
بۆ بنێژرێ نەوجەوانی پێگەیشتووی وەك نیهال

---

(*) لە (۲٤/ ۳/۱۹۲٥) ی. ز. وتراوە.

لەحزەیێ نەبڕا لــە بــەدخــواهـانی ئــەم قــەومــە فــەرەح
خێر خــواهیش نــەبــوو ئــانــیٚ وا بــەبــیٚ حــوزن و مــەلال

درزی ئــەرزیٚ هـــەر نییە ئێسـکێکی کــوردی تــیـا نــەبــیٚ
ســـەگ نییە نــەی خــواردبـــیٚ گــۆشتی ژنێکی یــا منــاڵ

وا بــە خوێنــاوی ســـرشــك و خــامـــەیــی خــامــی مـــوژەم
ئــەم عــەریـزەم نووســی نامەرد بــۆم بــەرە بــادی شــەمــاڵ

بی بەرە مـێـشکی هــەمــوو ئــەفــرادی قــەومــی کــوردەوە
تــا لـــە قـــوڕنیشن لـــە ڕۆژی مـــاتـــەمــا ئـــال و عــەیال

ڕۆژی تــەئــریــخــی لـــە بیســت و چـــواری مــارتــا واقیـعــە
ڕۆژی مــاتــەم ڕۆژی قــوڕ پــێوانــی کــوردە کــوللــی ساڵ

قــەت بــرا نــابــیٚ گــلـــە لـــەم قــەومـــی خــۆتــانــە بــکــەن
دەردەدارن بــۆیـــە نــاگـــەن بـــۆ ڕەفیـقــانــیــان بــە بــاڵ

دەست لە شەرحی دەردی کورد هەڵبگرە (حەمدی) چاترە
نـــەك بکـا نــەقلـت هــەتـا ڕۆژی حــەشـــر جــەڕی مـــەقـال

# گۆرانی نەورۆز(*)

١٩

بەهـ بەهـ چ ڕۆژێکی نەوە    هەی هەی چ عومرێکی نەوە
هەوا دەریایی پرتەوە    گوڵ بۆ چەمەن بەسەر ڕەوە
سەوزە جڵەوکێشی ئەوە    دنیا وەك باغی خوسرەوە

شیرینە جێی سەیرانەکەم
ئەمما بدەی جەژنانەکەم

سەحرا هەموو سەوز و سوورە    چەشمە مەنابیعی نوورە
گڵ وەك کلی کێوی توورە    نەغمەی نەسیمی سەمتوورە
زەمین بەهەشتی پڕ حوورە    عالەم غەمی لە دڵ دوورە

جاریێ بدە جەژنانەکەم
ئەوسا وەرە سەیرانەکەم

گوڵزارێکە چ ڕەنگینە    دنیا سپی و سوور و شینە
لالە و وەنەشە و نەسرینە    ڕەیحانە و مینا چین چینە
شەستپەڕ خەریکی پەرژینە    هەر ڕۆژی وا ڕۆژی ژینە

(*) نەورۆزی ساڵی (١٩٢٥) ی. ز. وتراوە.

زووکە بدە جەژنانەکەم

تێکی مەدە سەیرانەکەم

هێنایە لەنجە دەستی چڵ

وەك جامی بادە عەتر و گوڵ

عەرعەر تەقانی دەستوپل

سەما سەما ئەکا بە خول

نەی کەوتە خوێندنی بە دڵ

نابیٚ ببم زیاتر خەجڵ

زۆری بدەی جەژنانەکەم

خۆشی ئەکەم سەیرانەکەم

ئەووەلی ڕۆژی بەهارە

هەوا پاك و میشکبارە

فەسلی کەنار و جۆبارە

جامم لە نەشئەی سەر شارە

وەعدەی ویسالی دڵدارە

هەر جارێکە و هەر ئەمجارە

بەسیە بدە جەژنانەکەم

بەڵکو بچمە سەیرانەکەم

تۆ ماهی و من ئەختەرت

تۆ شاهی و من ئەفسەرت

تۆ ئەهلی دڵ من دلبەرت

تۆ یاری و من یاوەرت

تۆ ئاغای و من نۆکەرت

ڕۆحم بەسەر گەردی سەرت

کوانێ بده جەژنانەکەم
ماتەڵ نەبێ سەیرانەکەم

گوڵ غەرقی ئاووڕەنگە — غونچە دەم ودڵ تەنگە
نێرگز گێژ وو دەبەنگە — بولبول لەسەر ئاهەنگە
ڕۆژێکی شۆخ و شەنگە — لوتفێ بکە درەنگە

بێنە بدە جەژنانەکەم
بچم بۆ سەر سەیرانەکەم

قەدەح مەست بوو ڕشایەوە — عومر لە نوێ نووسرایەوە
گوڵ پێکەنی گەشایەوە — شەونم وەك من بەشایەوە
چرۆی درەخت ژیایەوە — غونچە دڵی کرایەوە

با بەس بڵێم جەژنانەکەم
زایەع نەبێ سەیرانەکەم

وەتەن غەرقی عیشوە و نازە — ئەلحەق لە ئەرزا مومتازە
قەلی شەلی ئەڵێی قازە — کەوی هەموو ئەڵێی بازە
بە قاعیدە ئەمەند شازە — وەختە بڵێم کە ئیعجازە

ڕۆیشتوون هاوڕێکانم
بدە پارە پڕ گیرفانم

# سکالاّی نیشتمان

## پێنجین

(١)

٢٠

ئەی خاکی وەتەن بێ فەرەح و زەوق و سەفا خۆت
پڕ حادیسە مەحکوومی هەموو حوکمی قەزا خۆت
بازیچەیی سەرپەنجەیی ئەربابی ڕیا خۆت
بێ ئۆردوو بەبێ زەمزەمەیی شاهو سەرا خۆت
سەد ئاه کە بوویتە هەدەفی دەرد و بەلاّ خۆت

ئەم کوردە ئەبێ دائیمی هەر قوڕ بەسەرا کەن
هەر جارە لە گونیە ئەبێ بەرگی بەبەراکەن
وەك تەعزییە ئەلواحی ڕەش و شین بەدەراکەن
پێویستی چییە دوژمنی خۆیان بە براکەن
عالەم کە بڵێن ساحبی ئەولاد و برا خۆت

گەر وابێ تەمەددون مەن و وەزعییەتی وەحشەت
سەد خۆزگە بە زوڵمەت ئەمەبێ حاڵی عەدالەت
دەوڵەت ئەمە بێ ڕەحمەتی سەدبارە لە نەگبەت
دەرمانی نییە عاجزە لەم عیللەتە حیکمەت
چ بکەم چ بڵێم ئێستەکە مەحکوومی فەنا خۆت

بێ دەرپێ ئەبینم بوونە ساحێبی دەرپێ
بێ جێ هەموو دیارن بوونە ساحێبی ڕێ و جێ
ئاساری نەما شوێنی کورد بوونەتە ژێر پێ
فەوتاوە نەزم ون بووە من کێم و ئەتۆ کێ
بێ عالیم و بێ سانیع و بێ ئەهلی وەفا خۆت
وەسفت کە نەگونجاوەتە ئەفکاری چ شاعیر
نەوعی نییە ئەرزت نییە شوبهەت بە مەنازیر
وەك گەوهەرە بەرد و گڵەکەت عەینی جەواهیر
بێ میسلە موحەققەق چ لە باتین چ لە زاهیر
بەم خەزنەیەوە مونتەزیری لوتفی گەدا خۆت
کوا تاقمەکە و وەلوەلەیی دەوری کەریم خان
کوا دوازدە سوارەیی بەبە مەشهووری مەریوان
کوا فیرقەیی بتلیسی هەواخواهی بەدرخان
کوا میللەتەکەی مونتەفیقی دەورەی تورکان
بێ پیاو و بەبێ کۆمەڵ و جێما و جیا خۆت
هاوسێ هەموو وەك داڵن و ئەم کوردە وەکو لاك
چنگیان لە جگەرگاهی هەموو داوە بەبێ باك
بێ خوێنە گوڵی زەرد و زەعیفە وەکو خاشاك
(حەمدی) دەبپێوە قوڕ و سنگت بکە چاك چاك
بی قەوم و وەتەن پڕئەسەف ودەرد و جەفا خۆت

## وەڵام بۆ عەبدولخالیقی

## ئەسیری

(٢)

٢١

خــەزنــەیــە ئــاو و گڵت ســاحبی دار و و دەوەنــی
بە ســەفا چەشنی بەهەشتی کەچی بەیتولحـەزەنــی
جێگـە سـەیرانی عیراقی بـەڵێ زۆر شـۆخ و شـەنـی
چونکە بـێ پیاوی بە ئـاشـووبـی خەریکی فیتەنـی
چۆنی ڕوو بێ کـە بڵێ میللەتـەکـەت تـۆ وەتـەنـی

وەرە تــۆ مــەردی خــوا بـــە هــەڵیخـە پیاوی چاك
ســاحبی تــەبع و عــەقــڵ عــامیلی عــەزم و بـێ باك
نەوەکو من وەکو ئـەم خەڵقە کە کـەوتووین وەك لاك
لــە لـەکێکا کـە نییە ئـەهلـی کیفایـەت یـەك تاك
چۆنی ڕووبێ کە بڵـێ میللـەتــەکـەت تـۆ وەتـەنـی

وەرە بـنـوارنـــە ئـــەم وەزعـــە بـــە دیققــەت ســـەیـرە
میللــەتـێ بـــەم زلـیـیـــە هــێنــدە قــەدیـم و قــەیـرە
وەکو گۆ کـەوتـووەتـە بــەرشــەق و لیســی غــەیــرە
ئــەمــە حــاڵـە ئــەمــە ژینــە شــەڕە یــاخــۆ خــەیـرە
چـۆنـی ڕوو بـێ کە بڵێ میللەتەکـەت تــۆ وەتـەنـی

گەورە بێ دەرکە دەرك خاسە نەسیبی دوردە
لە شەرابا نییە نەشئە نە شەهێنی دەردە
بۆیە بەدبەختە گوناهی ئەمەیە ئەم کوردە
کە نەبێ پیاوێ بڵێ وادەی دەس و بردە
چۆنی ڕوو بێ کە بڵێ میللەتەکەت تۆ وەتەنی
سەبەبی ئاو و هەوا و گردی بڵاوی تۆیە
تەفرەقەن میللەتەکەت دیارە فەقیرن بۆیە
غەیرەیە دوژمنیان دوژمنیان بۆ خۆیە
پێ لە پێوەندە کەوا تەوقیشی لەسەر ئەستۆیە
چۆنی ڕوو بێ کە بڵێ میللەتەکەت تۆ وەتەنی
لە دەمی هیچ کەسێکا نییە باس و ناوت
هەر سەگێ هەڵسێ بەبێ ترس ئەکەوێتە ڕاوت
مۆدەمان ڕۆیی بەسەرچوو بەسەری تۆ ناوت
بۆ ژیان مونتەزیری لوتفە لە غەیرە چاوت
چۆنی ڕووبێ کە بڵێ میللەتەکەت تۆ وەتەنی
سەبەبی حاڵەتی تۆیە لە ژیانا بێزار
وەکو کوڕمردوو خەریکی ئەسەفە و شیوەن و زار
(حەمدی) شێتانە کە ئەتلێتەوە میسلی بیمار
نییە بێ چارە حەکیمێ نییە چاری ناچار
چۆنی ڕوو بێ کە بڵێ میللەتەکەت تۆ وەتەنی

